زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان



# پەپووی سولەیمان






دارشتنی هۆنراوە
ناجح محەمەد قەرەداغی
نیگار: دڵشاد عەلی

چاپی دووەم

ئەفسیر
هەولێر
١٤٢٥ ك ٢٠٠٤ز

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان



# پەپووی سولەیمان

هۆنراوە : ناجح محەمەد قەرەداغی

نیگـــار : دڵشـــــاد علـی

التفسیر

هەولێر/ شەقامی دادگا ت: ٢٢٢١٦٩٥ ـ ٢٢٣٠٩٠٨

tafseeroffice@maktoob.com. - altafseer@hotmail.com.





نـاوی نامیلکە: پەپـووی سـولەیمـان
هۆنراوەی: ناجح محەمەد قەرەداغی
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسـیر
نیگار و نەخشەسازی: دڵشـاد عـەلی
ساڵی چاپ : ١٤٢٥ك - ٢٠٠٤ز
نۆرەی چاپ : دوەم
چاپکردنی : چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ : ٤٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ٤٥٥ ساڵی ٢٠٠٠

**خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:**

وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾
إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن
دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى
يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ
ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ سُورَةُ النَّمْلِ

**واتە: سولەیمان چاوی بە باڵندەکان دا گێرا، گوتی: چۆنە پەپو سـلێمانە نــابینم، ئاخۆ خۆی دزیوەتەوە؟ لەسەر ئەمە دەبێ سزای زۆری بدەم؛ یا سـەری دەبـڕم، یان دەبێ بەڵگەیەکـی ئـاشـکرا بۆ من بێنێ.. ماوەیێ زۆری نەخایاند، هات و گوتی: من شـتێکم دەسـکـەوتوە، کە دەستی تۆ نەکەوتبو؛ وا من لە (سەبا)وە هاتوم، دەنگوباسـێکی دروسـتم بۆ هێناوی، من لەوێ ژنێکم دیوە پاشایە بەسەریانەوەو خاوەنی هەمو شتێکەو تەختێکی پاشایەتی زۆر گەورەی هەیە. دیتم، کە خۆی و هۆزەکەی-جگە لە خودا- سـوژدە بۆ خۆر دەبەن و شـەیتان کردەوەکـانی بۆ رازاندونەوە و رێگەی هەڵەی نیشـان داون و رێی راسـت نادۆزنەوە. دەبوایە سـوژدە هەر بۆ ئەو خوایە ببەن، کە نهێنی ئاسمانەکان و زەوی ئاشکرا دەکات و، هەرچیەک بشـارنەوە و هەر چیەک ئاشکرای بکەن، ئەو دەیزانێ. ئەو خودایەی جگە لەو هیچ شـتێک بۆ پەرستن نابێ و ئەو خاوەن و پەروەردگاری تەختی فەرمانڕەوایی هەرمەزنە.**

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنْ الدَّوَابِّ النَّمْلَةِ وَالنَّحْلِ وَالْهُدْهُدِ وَالصُّرَدِ (سنن أبي داود وابن ماجه ومسند أحمد)

**واتە: ئیبن عەباس گوتویەتی: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە، کە نابێ چوار لە زیندەوەران بکوژرێن: مێرولە، هەنگ، پەپوی سولەیمان*، پەڕبەڵەکە (چۆلەکەگرە)**



*** پەپوی سولەیمان، پەپووسلێمانە: درێژییەکەی (٢٧) سانتیمەترە.**

**نێرە و مێینەی یەک ڕەنگە، سەر و ملی قاوەیی کاڵە. کلک و باڵی بەڵەکە، کاکۆڵی قاوەیی کاڵە و سـەری کاکۆڵی ڕەشـە.**

**دندوکی باریک و درێـژ و خوارە. لەسەر عەرز چینە دەکا.**

**لە کونی دیوار و داراندا هێلانە ساز دەکات، بە هاوینان زۆرە.**

منالّینه وەرنەوە
لە دەورم کۆ ببنەوە
با چیرۆکێ لە قورئان
چیرۆکی مەلێکی جوان
پەپووسلێمانەی ناوە
هەموو دنیا گەڕاوە
سەربازی سولەیمان بوو
خاوەن وەفا و پەیمان بوو
بۆتان باسکەم بە وردی
بە ووشەی جوانی کوردی



سولەیمان پێغەمبەر بوو
خاوەن سووپا و سەنگەر بوو
بە ئەمری خوا و داوای خۆی
زۆر شت مل کەچ ئەبوون بۆی
ڕەشەبای دێنا و دەبرد
لەگەڵ مەل قسەی دەکرد
سووپای سولەیمان تێکەڵ
لە مرۆڤ و پەری و مەل
زۆر کاری پێ ئەسپاردن
بۆ جێی دووری ئەناردن

پەپو سلێمانەی جوان
سەرباز بوو لای سولەیمان
پەپوو چوست و چالاک بوو
لە فڕیندا بێباک بوو
ڕۆژێک پەپوو دیار نەبوو
سولەیمان زۆر تووڕە بوو
وتی بێ ئیش ڕۆشتبێ
تووشی سزای توند ئەبێ





لەپڕ پەپووی پۆپنە قیت
نیشتەوە بە ویتەویت
وتی هەواڵم پێیە
دڵنیابە لەو جێیە
سەبەئی ئاوەدانە
ئافرەتێک پاشایانە
بەڵام خۆر دەپەرستن
بەرامبەری دەوەستن
بۆ ئەو خۆ ئەکەن نەوی
سەر ئەنێنە سەر زەوی




سولەیمان ئەوەی زانی
بەناوی خوا و بە جوانی
خێرا نامەی بۆ نوسین
بە وشەی نەرم و شیرین
کە بێن و موسڵمان بن
بۆ چاکە لەگەڵمان بن



ئەوسا پەپووی ئێسک سووک
نامەی هەڵگرت بە دەنووک
بە قوڵایی ئاسمانا
فڕی بەسەر شارانا
پاش چەند ڕۆژ ڕێگا بڕین
ماندوێتی و ئارەق سڕین

رۆژێک دەمەو ئێوارێ
گەشتە ئاسمانی شارێ
ناسیەوە سەنعایە
شاری بەلقیس پاشایە

چووە کۆشک بە پەنهانی
هیچ کەس بەوی نەزانی
نامەکەی بۆ فرێ دان
ئەرکی خۆی بەجێ گەیان
بەلقیس نامەی کردەوە
پیاوانی کۆکردەوە



ووتی نامەی سولەیمان
بە ناوی خوای میهرەبان
دەڵێت بێن و میوان بن
لای ئێمە موسڵمان بن
ئێوەی پیاو راوێژکارن
قەڵای وڵات و شارن
ڕاوێژکاران پێک هاتن
کە ئامادەی خەباتن



بەلقیس ترسا سولەیمان
هێرشێک بکات بۆیان
بشکێنێ دەسەڵاتی
ژێرەو ژوور کا ووڵاتی
بۆیە ویستی بەدیاری
بچێتە کۆڕی یاری



سولەیمان دیاری پێگەیشت
مەبەستی بەلقیس تێگەیشت
ووتی سوپایەک دێنم
لە ڕەگ دەرتان دەهێنم
بۆ دیاری دانەماوم
خوا زیاتری پێداوم
دیاری پیادا ناردنەوە
هیچی لێ نەشاردنەوە
بە بەلقیس بلێن ڕاکە
تا زووتر بگەن چاکە



ئەوسا ڕووی کردە سوپا
ووتی کێیە هەر ئێستا
داواکەم بەجێ بێنێ
عەرشەکەی بەلقیس بێنێ
کەسێکی توانا و زانا
ڕۆشت و عەرشەکەی هێنا





ڕووخساری عەرشیان شێوان
تا بزانن بەلقیس خان
ئاگادار و زرنگە
یان بێهۆش و دەبەنگە
کاتێ بەلقیس گەشتە جێ
لێیان پرسی دەست بەجێ
ئەوە عەرشەکەی تۆیە
وا گەیشتۆتە ئەم جێیە؟
ووتی: هەر ئەڵێی ئەوە
ئەمە ڕاستە یا خەوە؟!
سەری سوورما چۆن خێرا
عەرش هێنرا و شێوێنرا



کاتێکیش لەبەر دەرگا
سەرنجی ناو کۆشکی دا
وای زانی ڕووی دەریایە
ئەی چۆن وا خەڵکی تیایە؟
دی ناو کۆشك هەمووی ئاوە
دامێنی خۆی هەڵداوە
سولەیمان ووتی: خانم
بەخێر بێی سەر چاوانم

فەرموو بڕۆ تەڕ نابی
لێرە تووشی شەڕ نابی
ناو کۆشك ئاو نیە زەمینە
هەمووی بەردی نەخشینە
دەبریقێتەوە وەك ئاو
شادی ئەبەخشێ بە چاو

بەلقیس کە دی ئەمانە
سەروو توانای ئینسانە
ووتی: لەگەڵ سولەیمان
بوومە بەندەی خوای هەموان.

ئینجا پەپووی باڵ نەخشین
بە هەست و سۆزی شیرین
سووپاسی خۆی دەربڕان
بۆ خوای گەورە و میهرەبان
لە کۆتایی چیرۆکمان
درود و سڵاو بۆ هەموان



